# ئامادە كردن بۆ سەر ئینتێرنێت

ناوەندی کوردeکا


بۆکان:

محەمەد ئەمین شاسەنەم: ٦٢٢١٣٤٠

عەلی جەوشەنی: ٦٢٤٢٩٢١

E-mail: shasanam983@yahoo.com

ناوی کتێب: مەجنوونێک بۆ بێتاقەتیت

نووسەر: سروە شەریفزادە

چاپی یەکەم: رێبەندانی ١٣٨٤ (٢٠٠٦)

پیتچن: محەمەدئەمین شاسەنەم (بۆکان ٦٢٢١٣٤٠)

رووبەرگ: شێربەگی

ئەژمار: ١٠٠٠ بەرگ

(لەسەر ئەرکی سەردار شەمزاو لە کوردستانی ئازاد لە چاپخانەی ئاگرین لە چاپ دراوە. مافی لە چاپدانەوەی بۆ نووسەر پارێزراوە)

# ناوەرۆك

بۆ:

برژانگێکی پەپوولەکەی مێهرەبانم

گڕی هەڵبەستە دواشەوەکانی ترم لە غەمزەی باڵەکانی نێڵ ئەدەم...

بیابان بیابانم لەبەر پێیدا تەرخان دا بۆ ئەو گەشگەساتە:

ڕێی «بێتاقەتیی» لە پەڕاوی ناوتەکانی جنوونم بکەوێ.

پاییزێکی تریش هات، نەیخوێندەوە . وشەکان هەروا دەستیان بە دەست نوێژی فرمێسکەوەو لەئینتزاری سەرنجێکدا.

ئەو باش ئەیزانی مەودا کۆتایی ئەوین نیە. ئەمشەوی ساردی سەرەتای پاییزم باش ئەبیستێ گەڵاکان کە ئەکەونە خوارەوە لەبن پێیاندا تەنیاییم چۆن ورد ئەبێ بە مەرگ، ئەو خاڵ بەخاڵ جێنەشتەرەکانی ڕۆحمی لەبەرەو زۆر باش ئەزانی ــ هەڵبەستەوان چاوەکانی ــ نیوەشەوانێك ئەو لە شیرین خەودایە، شەتاوەکان لە ژووره شێدارە کەیەوە ڕا ئەدا و لەسەر هەر فرمێسکێ چیایەك مێخ کوت وەهەرچیایەك بەڵگەیەك سوور" کە تەنیا هەر ئەوەو هەرئەوە و هەر ئەو...

بەڵام نەیخوێندەوە، پاییزێکی تریش هات

سروە شەریفزادە

٨٤/٧/١

# پێنجی یازدە

نازۆکەم، سڵاو
کە نازی لێك دانی پێلوویەکت
تا مێعراجی
هەزار خولیا ئەچم...

لەپێنجی یازدەی
ئەشق سەنگباران کرانەکەوە
بۆت ئەنووسم.
پێش سڵاو بۆ ئەو سروەی
لە نەفەسی تۆدا لەدایک ئەبێ و
سڵاو بۆ...

## زۆرم بیر کردوویی

– ئێمە –
بە ئامێزما نایەت
– من –
تۆ، بە «با»ی هزرتا:
– ئاوشەوی – ئەو گورگانەم
تا بەیان ئوووووووو

دوای ئەوەی
بارتەقای هەرچی ئەهوورا

## خۆشم ئەوێی

ڕەزی پاکی دەستەکانت هی منن

– شەڕاب –

شەرمەزار

تامەزرۆی مەستی ی

مەینی باخم نەکەی..

ئەوە ئەڵێم نازۆ گیان:

مەودایەکە و

هەزار گزی و

ڕا ڕای ڕێگا

سوێندی شەقڵی گۆنام نەشکێنی..

حەی حوو!!

سروە خانی تۆ لێرە

شاعیری ناو نازدارانەو

دروێنەی ئاویلکە ئەکات

– دەواتی یەقین –

کە سیاسەت ئەشقە و

نان ئەشقە و

نیشتیمان ئەشقە و
پشت تا ئادەم ئەشقە و
ئەشق...............

بەڵام مەپرسە
چۆن دێوانە بووم و
چ مەبهووت..
ئەگەر بڕۆم
ئارانەکانی ئەشقیا بوونیشم
بە دواما دێن..
ئەگەر بڕۆین
ئۆخژنی زەمەن
چرکەیەکی بەتاڵی نیە..

نا.. بایەقووشەکانی بەختم مەگەوزێنە
ئیتر کێ هەیە
ئاخێك بۆ من و
مۆمەکانی سەر تەرمی بێمەزارم ببات..

بمبوورە
بەرگەی پێکەنینێکی ساردیش ناگرم
– گەورەییتم سڵامەت –

لە ژوان گەڕێ
کە هەموو لای هەینییەك
هۆڕەی بارانی گوێ لێ ئەبێ و
لە چاوەکانم
بڕوایی نەدا
بۆ ئەو پەنجەرەی
تۆی لێوە دیار نەبێ و
ئەو سەرینەی
دڵۆپ.. دڵۆپ
نەمگەیەنێتە جێژوانی ناخت..

– من وێنەی هەردووکمانم
لەچاوانی

کۆترێکی حەرادا هەڵگرتبوو
هەڵفرین.. نا
گەردەلوول .. نا
نەچیرەوان .. نا
ڕۆئیای حەسوودی بەختەوەری
لەگەڵ خۆیدا بردی –

فرمێسکەکانت بسڕە، کەسەکەم
ئەزانم بەوە نیە
چەنێك خۆشت ناوێم
تەنانەت باڵندەکانیش
کابرایەکی سەرتاپا «دڵ» یان
لە خەوی دار هەنجیری بەرپەنجەرەدا
دیبوو..
ئەمە بوو
ئیمانم بە زیندوو بوونم هێنا و
عاسای نووحی ماچ
تۆفانی – نێوانی –
بەخشین.

ئێستێ
کۆڵانم گسك داوە و
گڕی فانووسەکانم
دەسماڵ کێشاوە و
ئاوی غەزەل ماسی‌یەکانم گۆڕیوە
تا.. تەیەمومی هەرێمم
لە هەنگاوەکانت

## یەکەم ڕکاتی ئەشق

خودا حافیز..
نوختە..
ئەوە هاتم..
ئەوە ڕۆیشتم..
هەڵپە..
سەما..
سەما بە دەستێکمەوە

دەستەکەی ترم:

دڵم کوا؟

دڵم کوا؟

٢٠٠٥

# تا.. نەشکان

تێر گریانی سەرشانی ڕۆژئاوا نەبووم
دەستێك بە تاریكانیدا
بۆ دواوە بكێشە
من قەرزی شەونم و
جیرەی مەتارەی
دوایین ڕێبواری شەو لامە و
هێشتا كوڵێك
تا بێ جەمسەریم...............

هۆ.. باویژگە
لێرەم ببە
لە قەهری قیری هەستی شار..
لێرەم
کە ئاشقەکانیشی
بە نەوت ئەشقیان گڕاوی‌یەو
چەقۆی خێناوی دڵ
لەناو ماچدا ئەشۆن...

لێرە
کەس مەرگی سنووری بەڕاست نەگرت..
دەڵانی ئاسن
لەناو زایەڵەی زەمەن..

ڤیان.. ڤیان.. ڤیان...
وەرای دەست فروشێك بوو
کڕیار:
ئومێد بە دوو پات بوونەوە..

کەس زەینی نەدایە زەریا
چاوی ماسیش فرمێسکی هەیە..
بەردیش دڵی هەیە..
کەس بۆ واتای شێعرێك
دڵی نەگیرا..
گرینگ نیە
ژووری لێڵی پارسەك
دەستی کورتی بە مانگ نەگەییشت..

ئەمشەو
دەفتەری هاور وەریەکانی ئاوێنە
لە داوێنی بێ تەرمی یاسادا جێ دێڵم
تڒی تەشتێك بەرماڵم داناوە بیشۆم،
کفنێك بۆ خودا و
مەشغەڵ بدوورم..

دڵدارەکەم خەوی لێ کەوتووە
تەنیا ـ تەجەسوم ـ ی
پڕ بە جانتای ڕوانینمە

لە بێشکەیەك
لەگەڵ چوونی ساتەکانم ڕاژەنم
ئەبەم.

من قەناعەتم
گەرمی پەنجەکانیەتی
هەزار دەرگا..
ئەوندەی شوێن پێیەك یەکیەتی
هەزار زەوی ڕەوان..

ـ من ژیان بە باڵای دڵدارەکەم ئەگرم ـ

ئەوەی
وەرزی مەرگی باڵندەکانی ئێمەی دیاری کرد..
ئەوەی کلدانەکەمی

لە بابووسکەی شتێك پڕ کرد
وەك ئەوین...
پێم وایە ئەوین...
ڕەنگە ئەوین...

ئەوەی ڕێی زنەی
لە ڕەگاژۆی تینوویەتیم خەڵەتان
کە هێشتاش
گوێم لەخوڕەی سەرابە هەر..
گەر ئەوەی..
من ترسم بەقەد
خشپەی نەبزی پاییزە..
گومانمە لەجەندەکی خۆڵەمێش..
من پەپوولەیەکی شاعیرم و
لە گلۆپی دارتێلی کۆڵانەکەمان ترسم هەیە..
ترسم هەیە
ئەوەی...

ئەمشەو چ بارانێکی لێڵ
هەناسە نیشان کردووەکانی

شەقامی دوایین ئامێزم
ون.. ون باریوە

تۆ دوای ئەوەی
خۆم نەناسمەوەو
هەموو ئاوێنەکان خۆیان ورد کردبێت..
بەر لە شەهادەتی مەنداوەکانی
شایەتی:
باڵ گرتنی پاساری
بمگەیەنە ساوا بوونەوەی مرۆڤ و
لە ناو لەدایك بوونی سێودا
غوسڵی ژیان بگرم.

وەبیرم مەهێنە
لە کام سێبەرەوە هاتووم..
ڕۆژنەکانی کراژی هیوام بشکێنە
تێکی.. تێك

ژیان لە ناو کاسەیەکی فەقردا،
لە نێوان چقڵستان و هەور،
لە جێ دەندووکی کۆترێکدا،
دابەش کەین..
بێ گومان
لەو بەری بایەکانەوە
ئەوین بژیوی ژیان بێت..
وەلوانی گوڵە پەپوولە بوونێك..
ئەبێ دڵ لەوێ
ئاسمانیی بێت ڕەنگی..
لەوانەیە شەپۆل
لە هەوادا جاری بێ و
نوێژ لە پشت سەری
پەلکە گیایەکەوە دابەسترێ...

لەمن،
لە پێڵاوەکانم،

تەنیا بارانێکی لێڵ لە بیرمەو
جانتای ڕوانینم.

تۆ خاوسانە بمبە تا
تەشقی قووڵترین نەشکان
کە تینوویەتیم – نێڵ..
تا.. نوتفەی ئاو
سەرپۆشی عیسمەتی ناخمی پێوە – گرێ..
تا.. فڕین
باڵی ئەوین لە کونە پەپووی ئەوکم..
تا.. ئەوبەری بایەکانەوە

تا.. ئەوەی «ئایا»مەو
– سوکت –
بە قەد خشت بە خشتی
دیوارەکانی هەڵوەداییم دانیشتووە
بمبە تا .. نەشکان

٢٠٠٥

# جەغزێك و هیچ

زیندووم
ئەگەر جارێك ترە و
لە سەر كورسی ناو كافەیەك
تێر سەیرت بم..
ئەگەر شەو بێت و
دووپات بیتەوە
لە ناو خەونەكانم ..

ئەی لە تۆ زیندووم
دڵخۆشی من
ئاوێنەی بەردی
بێ سەرنجیتە
هەڵەمووتی ئەوینمی لە بەردا
هەرەس.. هەرەس بگریم
هاتوو بەدیت..
هاتوو سەبووریم
لە پاڵ بنچە پنگەی
دوا رۆژەکانی پاییزدا هەڵی داوە و
ژیام – ئەوکاتە –

زیندووم
ئەگەر هێلانەیەك لە تەمەنتدا ئاواتمە و
لەتێك نانی وشكیش خۆشە،
سەر ڕایەخی حەسیر خۆشە،
بەر فانووسی نەوت خۆشە،
بە تۆوە
جەغزێك و هیچ .........

زیندووم وتت
لە چارەنووس گەڕێ
من بکە بە ئامانج

بارانێك لەژێریدا
دەرکم ناکات..
شەقامێك هەنگاوەکانم
بە سەر وردە شووشەی روانینمەوە
هەست ناکات..
پەنجەرەیەك
بوغزی ئەندێشەم نابینێت..
کەس
ئەو بەر شەتەکی ئینتزارم
لە دەستیدا ناگونجێت..
تۆ لە بەر تۆ
یەقین ناکەی زیندووم

زیندووم کە
ڕامانە ئێواران یادی تۆو

چرۆدانی باخچە
بۆنی ئامێزی تۆ و
لەحنی رێژنەی شەونم
دەنگی تۆ و
تۆ ، رێزی خودا
لە هەر خاڵێکدا ئەکەی....

بەڵام من ئەگەر نەتوانم
شەوێك لابدەمە دڵت و
سەری شێتیم
بە لای خۆشەویستیتەوە بنێنم..
ئەگەر نەتوانم
ئەوندە هی من بی
لە زستانێکی نیازی ساردمدا
شێوەت بێنمەوە بەر زەینی سوکناییم ..
نەتوانم ساڵ رۆژی ئەوین
لقێك گوڵ وەربگرم لە تۆ ..
تەنانەت
خۆشت ئەوێم؟ نا

**بەس شەپۆلاوی دڵم**
**بە گاشە حەرفەکانتدا بشکێنی ..**

**زیندووم تەنیا**
**خووم بە هیچت گرتووە و**
**زات ناکەم**
**بمرم بێ تۆ.**

**٢٠٠٥**

# یەڵدای من و مانگ

ناتسووتێنم
ناتسووتێنم
ناتسووتێنم

ئەمشەو یەڵدای من و مانگە
گڕ و کڵپەی جنوونم،
بۆچوونی هەوەس ڕوی تۆ..

هەر مێژووی قەیرەی دڵداریمان نیە
شایەتن کۆڵانەکانی محەمەدیی
ئێوارەی دووری منیان
بە تۆ ئەبڕی...
جگەرەی نیوسووت و
ئەوە توێکڵە کاڵەکەکانی ناو ئەلبۆم..
شایەتە ئەو پەڕەسێلکەی
دوازدە جار
لەگەڵ سروشت گەڕایەوە و
ئاوێنە ڕۆژ و ودار بوو..

ئەی شاپیاوەکە:
ئەتوانم یەکەم ئاوێتەی ڕۆح
بگوازمەوە بەردەم یاسای خۆر و

پەنجەرە شایەتی
سوور بوونت بدات
کە چۆن
دڵم ئەنا بەسەر پێمدا و
ئیتر ڕێگەکان
لە منەوە خۆیان جێ ئەهێشت..
کە بەر لە من
ئەگەییشتیە مەداری هەڵبەست
واژەیەك بۆ
چوار مێخەی باران و
نەپینەی ناسۆرەکانی ئاو...

– پێنووس بەناوی تۆوە ئەبوو –

تۆ نیت؟
تۆ نیت هەودایەك پرچمی
لاسەنگی گێتی ڕاگرت؟

ئێ ێ ێ ێ ێ ی .. ئازیزەکەم
کە نیشانەتم بو تەیرێك نارد و
لێوان لێو
بوومە سەمای مزگێنی
– تۆ –
تەنیا شێوەت بوو..!

من ئیتر
پاساپۆرتی ئەو سنوورە
کۆچ کردووەم دڕاند...

بۆ کویێ وا بە پەلە؟
بۆ کێ؟
هێشتا دیواری ئەم دوو دەستە
هەر باڵا ئەکا..
من باڵێك تا پەڕینەوەی
دەجلەی چاوەکانم و
چەند بڵێسەم تا.. خەڵووز ماوە..

ناتسووتێنم

ناتسووتێنم

ناتسووتێنم

مردنم ببینە جا بڕۆ...

٢٠٠٥

# کڵا

**زەمانی گیراوی گەڕەکی شاعیر**

**کڵا بوونت**

**دەمدەمانی ئێوارە**

**ڕەها ئەبێت**

**چ درەنگانێکە**

**نەهاتی و**

**باڵم**

**بۆ ئاسمانی سەربەستی ژێر هەنگاوت**

**چۆن تاسە.. تاسە**

**لەگۆڕ ئەدرێت......**

**٢٠٠٥**

## ڕەجم

بووە شەوانە
بەستەلەکی هەوراز .. هەوراز
ڕچەی ئامێز شکان،
پێڵاوەکانی ڕقی مردن،
ئەڵقەڕێزی
دەرگای بێدالّدەیی خۆشەویستەکەت
نابێتە ژێر سەرت...؟

**بووە تا بوونەوەی ڕۆژ**

**بە کوڵ**

**تا.. گۆنای خودا گریابێتی بۆی ؟**

**ئەی بووە**

**هەمان خۆشەویستت**

**بەردی تەواو مەملەکەتێکی**

**هەڵکردبێتە دڵت..**

**تۆ لەو بەردانە**

**قەڵایەکی خولیات بنەما کردبێت**

**بۆ ڕەجم کردنێکی تر...؟**

**٢٠٠٥**

# خاڵیی شیعر ؟!

له وه‌ڵامی نامه‌ی ئازادیخوازێکی سه‌رچیا

شەکەت.. شەکەت
لەنگەری خێناویی ڕێکەوتی شاخ
تێزاوی هەنگاوم...

شەکەت.. شەکەت
ئامێز لە ماڵئاوایی
ئەستێرە ناچارییەکانی
داوەڵ بوون
بە ئاسمانی لەمپەری نوورەوە ئەتەکێنم...

زرمەی دڵم شەکەت.. شەکەت
باڵ نەپسانەوەی
کۆترە باریکەکەی
بە تەشقەوە ئەنگاوی چوار چرا...

شەکەت .. شەکەت هەناسەم
یەك هاتنەوەی تەناف و
موتفەڕکی
ڕۆچنەکانی بەندیخانەیە...

دڵم بە تەنیا هەر هی ئومیدم نیە
هەر لەتێکیم
لەتراویلکەی ناولەپی
دەستی کرێکارێکدا چاندووە،

لە ناو چاوی نامۆی
کۆڵانەکانی گلێنی خوارەوەی نیشتیمان،
لە ئاوێنەی نەرمینێکدا
ئەگری.. ئەگری...

شەو نیە
شەکەت.. شەکەت
قاقڕی خوسپەی خووساوی دایکم
هەتا.. تۆی دەرکی زەریام
ئاوچۆڕ نەکەم...

ژوورەکەم شەکەت.. شەکەت
لە بن باڵی پەڕەسێلکە
ئاوارەیی بنچە گیاکانی گوڵانی
لە خۆیدا هەڵگرتووە...

من شەکەت.. شەکەت
لە مەملەکەتی پێخاوسانی ڤیان و
ڕێزمانی ساویلکەی باڵندەکانەوە دێم

هێشتا
فامی وشەیەکم
بۆ نەگەییوەتە دڵی خۆشەویستم
ئەوین

- پێنووسی مەزنی مێژوو
سەرخەمە
ترۆپکی چیای کرمۆڵی هاوار -

چی بکەم
زۆر شت بڕانەوەی بۆ نیە و
سوێند خۆری
یەکەم هەنگاوی ئاواڵەبوونی دڵداریم
تا..................

کاکا:
خاڵیی شێعر
گوێ بە بێدەنگیمەوە بنێ

کام ڕێبوار
لەخەمی زەینی جیهانەوە کڵا ببێت،
چرۆیەك لە کوێ بوە رێت،
ئەیبیستی...

٢٠٠٥

#ماڵئاواییت لێ ناکەم

ماڵئاواییت لێ ناکەم
با دەستەکانم هەر لە ملتدا بن..
هێشتا
هەزار دڵم لێرە کاڵە و
سەرینەکەم
نەگەییوە بە تەعبیرێك.

هاوڕێی بریندارم:
پەنجەرەی ژوورەکەم
لە بارمتەی گەڕانەوەما بەرە
ڕەنگە درەنگ کەوتم
حەشر زۆر دوورە..

نا.. ماڵئاواییت لێ ناکەم
ئەچم
سنوور ئەکەم بە بەر گەردەلوولدا
هێلانەکەمان لەسەر
ئۆخژی دەریا چێکەینەوە..
بەر لەوەی
کاتژمێرە نەزۆکەکەم
بگاتە مەچەکی یەکەم زنینەوە
ئەسپێرم
زریان هەڵکات
تا.. دوایین – سروەکان –
– سیپەلکت –

من بە تەمای مانەوە ئەڕۆم
شەقڵی ڕوخسارم
بۆ لە ناو باوێشکی ڕێدا چڕژاوە..
ئەمڕۆ
درێژترین خۆرهەڵاتمە هاوڕێکەم
چراکان بکوژێنەوە..

ماڵئاواییت لیٚ ناکەم
چەند چیا هەیە
ئەبیٚ بیانگەیەنمە سەر ڕکەی یەقین..
نیشتیمانێك لە ناباوەڕی..
وە دەستەکانی تۆ مات کێشاوم
لە مەعبەدەکانی سەر ڕێمدا
ئومیدێك دروست بکاو
کڕنۆشی بۆ ببەم...

من هەموو شەو

باڵەکانم لە ئاگری ئەستێرەیەکدا
غوسڵ ئەدا..
ئەی بۆ؟
ئەمە کام خۆش ویستنە
کە زەرد.. زەرد...

کە ئەڕۆم
بە کۆچم نەوت
دەرت کراوم..
ئۆه.. کە ئەستێرەیەکی ئاشق
هاتبوە خوارەوە
گوێ لە دوایین قەسیدەمت بگرێ
نەموت
تۆ بە پەنجەیەکی ئەوت
نەشام...
لە خوارەوەی دەرگای کۆشکی خۆشەویستیت
ئەم بەرزە جێم
لێ مەستێنەوە

نەموت...

گوێت لە بێدەنگیمە؟
چاوم لە وانەیە
ئەگاتە بیابانەکانی غەزەبی کوێرایی و
هەر بوغز ئەمچێنێ..
مەگەر من
چیم لە بەستێنی
لیوەکانی تۆ ئەوێت؟
ئەی بێ هەتا...

ئەبێ ڕۆیشت
ئەبێ ڕۆیشت
تا قەڵەندەری چرۆیەك..
ئەبێ گمەی کۆترە باریکەمان
لە نووکی خەنجەر بکرێتەوە و
بۆ جارێك باران بشۆمەوە...

ماڵئاواییت لێ ناكەم
با دەستەكانم هەر لە ملتدا بن..
ڕكە .. ڕكە
تا.. تۆ ئەشكێم
ئەشكێم
دێمەوەو
نوختەی پایان
لە بەر پەنجەرەدا دائەنێم.

٢٠٠٥

# ئەوین پەتایە و ...

خۆشەویستیم
لەتای سەنگ دەستی کێشا و
بە داکەوتنە خوارەوەی بنەمای زەمان
خۆی بە یەکەم باوێشکی شك گەیاند
- سەرکردەی دەستت -

نابێ  غەور لە بای مەملەکەتی
پاییزی من و تۆدا بنیشێت
نا... نا... نا... نا... نا...

وتم: ژیان
تا.. گڕ هەیە
پەپوولە ئەمێنمەوە ...
تا.. سارا
شێت...
تا.. ڕیسوایی
شاعیر...

وە تۆ سەری حورمەتت بۆ داخستم
مەرگ.........

یارە نەجیبەکەم:
تۆ نازانی چەنێك خۆشم ئەوێی..!
دەست بە سەر ناوەکەتدا ئەنێم

- من دڵم
لە ناو بەرددا
لە دایك ئەبێت ترپەکانم
تامەزرۆت -
ئەتوت:
ئەوین پەتایە و
هەرەسی ڕکەترین چیاش ئەچێتەوە...
ئەموت:
بەیداغی ئەوینت
ئەگەیەنمە هەموو سەر ڕکەکانی زەوین...
ئەگەر چاوەکانت هی من بێت
نووری خودای تیا چەپکە ئەکەم
شکستی خۆر.
ئەتوت:
ئیتر - هی - تۆ
هی:...............

ئەم وت:
خەوم دیوە

کاتژمێریان بە بووکی ئەبرد
بۆ ژوان و
ئەو شەوە تا بەیان
هەر گوڵە پەپوولە
لە پەنجەکانی پێماندا ڕوا و
ماچ برووسکەی دا...
ئەتوت:
گەر تەڵخ نەبی لێم،
ئەو دەمیش
لە هەودا کوچەی ئەوینی
شیرازە کراوی تابووتدا:
بۆ چرکەیەکت مردم
بۆ ژیانتم نەویست
قەه قەه ... قەه قەه

نازۆ گیانم:
لێم غافڵ نەبی
تا سەر شانی خودا ئەچم
سەر شینێك بشکێنم
دێمەوە لات

هۆن هۆن... هۆن هۆن

- بەڵام ئێمە بەرەی چاوگە یەکین
نابێ بێڵێن دەریا
لەم ڕۆچنە لێڵەدا بمرێت -
ئەتوت:
عۆدەی بەچکە ماسی‌یەکانی خەیاڵیش
تا بەهێزترین
شەپۆلی جیا بوونەوەت ناگرم...
تا عۆدەی تۆ..
تاعۆدەی گریان...

ئاخر چۆن لێت جیا بمەوە
هێشتا دڵۆپێك پێت نەگەییوم

دیسانەوە ئەموت:
تۆ نازانی چەنێك خۆشم ئەوێی

منێ كە بارانی ساڵت
تۆماری فرمێسكەكانم بوو...

من لێرە بە تەنیام و
بێ تو ناگەمە ئەمڕۆ
ئەتوت:
دەرفەتێك
لە پاییزی دوامین نوێ بوونەوەی ساڵمانەوە
بگەیە كۆچی پەرەسێلكەكانی ڕەهایی.

: بەندیخانەی دەستەكانت
باڵی ڕەهاییمە
ئەگەر تۆ...

ئەموت:
نازانی چەنێك خۆشم ئەوێی
ئەتوت:
ئەوین پەتایە و......

٢٠٠٥

# دیسان ... منیش...یەزدان

ئەو دەمەی
کۆتایی
لە بە خوا سپاردنی خەفەت
بە ڕچەی بیرەوەریدا
ئەگەڕێتەوە..

ئەو دەمەی
ئەستێرەی هەموو ئاشقە شاڵە بەگی‌یەکان
دەم ئەنێنە ناو دەمی یەك..
– کە خۆر بە خۆرئاوا ئەگات من –

منیش یەزدانێکم هەیە
لوێچی، شەو چرە چەمان
دەستی پەپوولەکانمی
لای بکەمەوە..
تارای سووری
بووکی خاپووری هیوام
بۆ لا بدات..

وە دەفتەری ناو قەدی ئاسمانی ئینتزار......

بەڵام دیسان
لا وەفاییت

**لە نەجابەتی گەنما ئەنووسم..**

**دیسان**

**لە مەیلی ساردی ئەوینی تۆ**

**ئاگر، ئاگر ئەدەمەوە...**

**دیسان..**

**منیش..**

**یەزدان..**

**٢٠٠٥**

## ئەو ئەزانێ

لێو.. لێو
هەڵدێری ڕۆحم ئەڕژێ و
زیندوو بوونەوەم
دەنگێکە
هەر جار بە درۆ
بەڵێنی بیستنیم پێ ئەدات..

دەریاکانم بە بەر ئینتزارەوە
وشك بوونەوەو
ئێوارە درەنگان
جگە لە هیچ کەس ئەگەڕێتەوە..
ئەو ئەزانێ
منیش دڵم گەڕانەوەی ئەوێ
لە جیاتی
بووکە شووشەی هاوپێخەفەکەم..

ئەزانێ چراکانم
یەك.. یەك لە ڕۆچوونە و
تکای ڕەشم...
ئەو ئەزانێ
ڕێیەك خۆم ئەزانم
بە ویست ناگات ئەبڕم
بەڵام
پەنجەکانم جێ نەهێڵێت..

من لە خودای زەردەشتی چاوەکانیدا
سوور ئەسووتم
بەڵام
سەرنجێکم نادات..!

٢٠٠٥

# دوا زرمە

چوون
بێ دەڵاڵەتی چرایەك
تا.. خۆر هەڵنەهاتی بەیان...

بە گریمانی
ئێوە، ئێمە بوون
سەرینها......
تەنیایی دەرکردن.

لەو دیو ترکزەی دەلاقەکەمەوە
ئاو چ تینوویە و
کڕ کەوتنی خاك..
دەمێ هەنگاوە بەرپێی دەستم
لە پێنووسێکەوە
دەست پێ ئەکا تۆ و
– گوارەکانم
بە ڕێی وەڵامێکەوە ژەنگی هێنا –

من کراژی شەیدایەکم
لەکاڵ بوونەوەی زەینی کۆڵانێکدا
تۆز شۆردییەوە
کە دامبەستبوو نوێژ
شەقڵی پێت

وەبێ ئاورینگێ
قوتبی ژیانم

بێ جار .. جار

نازێك دەستت

چوون

تا تەنیایی دڕندەی ئەشق..

چوون

بێ تۆ تا.. بێ کۆتایی تۆ..

من لە بن پێی گڕدا

دوا زرمەی دڵی پەپوولەم بیست

ئێ ێ ێ ێ ێ ی

باوەشی گەرمی هەتاوەکەم : تۆ

جارانێ

سارد.. سارد

تار.. تار

چوون

بێ دەڵاڵەتی چرایەك

تا .. خۆر هەڵنەهاتی بەیان...

٢٠٠٥

# «تۆ»

تۆ، یانی
لەوسەری تۆفانی جوگرافیای روحەوە
ئومید..
تۆ، یانی ڕشتنی ئاو
لە ڕەوانەی چرۆدانی لق..
تۆ، یانی
گەرمای هێلانەی کۆترە باریکە ..
تۆ ، یانی
نیوەی هەتاو و نیوەی باران ..
تۆ، یانی خاڵی نیە مەودایەك ..
تۆ، یانی یەکیەتی با و گڕ ...
تۆ، یانی نوێژ
بۆ ئۆخژنی بیابانی هزر...
تۆ، یانی رەنگی شەو بەیبوّنیيە..
تۆ، یانی
پایانی وەرزی سارد ..
تۆ، یانی پیاو ، سێبەر، ئەوین
تۆ ژیانی کاملّی من.

٢٠٠٥

# بۆ خەرمانانی لە دایك بوونت

چی بێنم
بۆ خەرمانانی لە دایك بوونت؟
جووت بوونی پیرۆزی باڵندە،
دوا چرکەی شەهیدیی مەزدە،
پەرژین،
ورەی شیاوی تۆی نەدا

ئەوە منم؟
لە کیشوەر بە کیشوەری
ئاشنای خۆشەویستیتدا
ناچمەوە سەر شەقامێك...؟
من دووگیان بە هەنگاوەکانت
بە دوازدە پشتی ساڵ
جا ئەگەینەوە
وەرزی چەکەرەی ڕامووسین
– بەرەی مشتێك خاك –

ئەی هێڵی ئەم نوختەچینە
درێژەی ناتەواوی
ئێوارە گڕاوی کام شاعیرە...؟

ئەی چرۆی کامڵ:
چ مەحڤ بوونەوەیەکی سەوزم

لە فەلسەفەی ڕوانینتدا...
ویڵ...
ویڵ...
ویڵ...

هۆ لەوێوە:
لە بێ هەتەریەوە
دەزگیرانی هۆو خۆر پیاوە کێ بێت؟
ڕەنگە پەرییەکی
هیچ ئاسمانێ نەکردوو؟
هێشتا
دەزووی شێعری سپی تەنیایی
لە فرمێسکێ هەڵ نەکێشاوەو
بۆ خەرمانانەکانی
داخڵەی سنوورێکی نەشکاندوە
ئاوا
ویڵ...
ویڵ...
ویڵ...

ئەی، ئەم قافڵە سێبەرە چین
لە پشت سەریەوە...؟
کاشفەکانی قەتیسی
– قووڵایی تیشك –

ژمارەی باوێشکی چاوی ئەوین
لە حەرەساتی
ئەم ناگەییشتنەدا..
چیها ڕووبار لە کوێرایی داو
خێنی ڕژاوی
ئەو شێعرە نەنووسراوانە و
ئەوە دوازدە سواری تەمەنی من..!
ئێ ێ ێ ێ ێ ی
ئەم پەنجەرە بریندارە ئەناسم!
بە ئاسمانێك پەپوولەی ڕەتێنراوەوە و

چیها عەسرەکانی بێهودەی ئەشق..

چیها غوروب..

چیها چاوەڕێیەك لە ژێر چنارەكاندا..

چ..ی.. ه..ا

مەجنوون

نووسی

ئەم

وشانە

بڵێی..؟

نەڵێی..؟

وێڵ...

وێڵ...

وێڵ...

لەیلا

ئەی: چاوەكانت تەواو مەوتەنم

لەو سەری شیاوییەوە

تووشی تۆ هاتووم..
ڕێکەوت
لێرە بەولاوە سیفرە و
دەستم لە دەستم بەتاڵ

– خەرمانان –

بمهێڵە
لە یەکەم سیلەتەوە
بگەڕێمەوە لەخت بوونەوەی ئاوێنەو
ئاژین کردن فێر بم..
فێری پەپوولە پاییزە بوون
لە گەڵاڕێزانی بزەت..
فێری گوڵە گەنمێك
لە بەرەکەتی هەناسەت..
فێری
بێدەنگی و بێدەنگی و...

فێر بم
ئاوێنەیەك لە جنسی ڕۆح
كە دێم
بۆ خەرمانانی لە دایك بوونت
وەك هیچ كەسەكەم:......................

٢٠٠٥

# نەمام تا بمرم

ئەگەر وتت
کە دەوارێك لە مندا خۆی ئەخست
تۆ مردبووی.
مردم...
ئەگەر وا غەوارە پێکەنیت
دیسان مردم...
بەڵام ڕووت سوڕاند
ئیتر نەمام تا بمرم
بمرم
ئەمشەو لە بیرەوەریدا
هەزار کەڕەت نەمرم...

٢٠٠٥

# ڕەهێڵەی کۆچ

ئومیدەکەم:
هەڵم مەسێنە و
ئامێزت لێرە بەرەوە
ئیتر سەرمام نیە..

نا.. نیازم ڕاهاتی
ڕەهێڵەی کۆچ
بڕۆ و
قەندیلی فرمێسکەکانم مەشکێنە
جارێکی تر
گۆڕ

٢٠٠٥

# نانیان بووم

لە شاڵاوی نەناسیاوی باهۆز
لە زاراوەی تیژی ئەڵماس
لە بێگانەیی
نەشکام

لەو دەستانەی
کە نانیان بووم...!

٢٠٠٥

# ئارام بنوو

من دایەنی ئەوینێك
خودایانە بەرین،
بۆ بەختەوەریت
ساوای، گریێ .. گریێ بە ڕۆحمەوە
لە بەرمدا هەڵگرت

گەڕامەوە
لە من..
لە دەربەندی چارەنووستەوە..
غەوارەیەك

ئەم مەودا نان نەبوو
نە پووڵ..!

هاوژین گیان:
پێڵاوەكانم
لە میلی كاتژمێر بكەوە
ئیتر زاوزێی
هیچ ئاوێنەیەك نامناسێت

– تەنیا مەرگی نێوان من و تۆ ژیاوم –

ئایا بەختەوەریت
ویژدانێك نەبوو
لە لەرزی سەرمای پەنجەکانمەوە
تا.. پژمەی گەڵاکان
بێ کۆتایی زەردی تەنیاییمەوە
تێپەڕدا؟

– ئارام بنوو
لە سەر سەرینی بێداری –

چاوەڕوانیت
گۆنەم بە تیشکی بەر پەنجەرە.. نا
بە ماچی دووپات بوونەوەی دابڕان
سوور ئەکەم..
بۆ بەختەوەریت
پەنجەرەکانم شکاند.

– خەو بوو – ئەرێ!

فوویەك لە هەتاو بكە
كە چۆن باڵام ئەچوێت..

خەو بوو ساوا و
خەو بوو
من دایەنی ئەوینێك
خودایانە بەرین..

ئارام بنوو.. بنوو.. بنوو...
بۆ بەختەوەریت.

٢٠٠٥

# پێناو

مەئشـــــــووقی مـــــــن تراژێـــــــدیای ئـــــاگر بـــــوو
نیوســـــــووت هێشـــــــتمیەوە و بـــــــووە پوڵـــــوو
بــــــەڵام دیســـــــان نامـــــــەردی پـــــێم نـــــــەکردو
لــــــە خـــــوارووی کۆتـــــایی دای کـــــونجێکم بـــــوو

لای چاوم بەست، بۆ نەبیستنی دڵم
شاسواری هۆزی ئالانت وتی: مردم
هاوشەققەی باڵی ئەشقی ڕۆژ، فڕی
تەنیا هەناسەیەكی سڕی بۆ نەبردم

فانووسی جێژوانی ئەوینی برد و
پرچی سازی ماڵئاوایمی ژەند و
بێ هۆ لە ناو خێڵگەی نازداراندا
خولیاكانمی دا لە خاچی ڕابردو

سروەی چیرۆكەكانم ملی دا ناگەم پی
لە پردی پەڕینەوە شیاوترێ لە منی دی
دۆزەخی ئاه و تاویاوی شێعرەكانم
قەت نەموت: یا خوا لە ئومێدم فەنا بی

ساحیبی ئەو ئەشقە ببە هی من بوو
هەڵکەوتن لە دووریێیە لێم ون بوو
گەر پیۆانەکانم لە «پێناو» جیا کەم
باڵ کوتانی پەلەتیکیش درۆ بوو!

٢٠٠٥

# لە کوێی؟

چـاوەکانم گلـەیی کردبـوو لێـت کـاتی سـەفەر
دەسـتت لـە لانکـی خـەوەکانم بـەرداوە بێخەبـەر
ژمـاردنی پەنجـەم تـەواو بـوو، نـەم گەییشـتیەوە
شەو نیە ئاوی ڕەوانەت نەڕێـژم ئەز، خـێنی جەگەر

نەکـــەی غوربـــەت بـــە بزەکـــانی جوانـــت دەرفـــەت بـــێنێ
ســـــرووەت لێـــرە دڵ لـــە دوا پێلـــو بـــە فرمێســـك هـــەڵبێنێ
هیجرەتـــت خـــۆش، ڕێـــت دەســـت لـــە ســـکاڵا ژێـــر ناکەمـــەوە
تـــــا.. گـــــەڵاڕێزانی ئێمـــــەش دوا گـــــەڵای هـــــەڵوەرێنێ

خـــۆ ئێمـــە نەگەییشـــتین بـــە یـــەك جگـــە لـــە ژوانـــی ڕۆئیـــا
بـــەڵام ئـــەو شـــەوە تریفـــەی دیبومـــانی لـــە نـــاو شـــەقڵی ڕێگـــا
مـــن و تـــۆ دڵـــی ڕیبەنـــدانی ئەشـــقین، ئـــەمرین لێـــك جیـــا بـــین
بـــۆ درێـــژەی ســـێزدەمان دێـــم لـــە دووت تـــا هەتـــەری دنیـــا

دەردم تەمێکـــە نایـــەڵێ پێـــت بگـــا دەنگـــم، چـــنگی تـــەنراوم
ڕەنگـــەش پێدەشـــت پـــێ دەشـــت شـــێتیت بیســـتم قـــەت نەتـــدوانم
نـــازانم ئـــەبێ دڵێـــك چـــەند ڕق بـــێ، بـــوتی ئـــەوینمی لێـــت شـــکاند
«مـــەجنوونی بـــێ تاقـــەتیت» شـــادم، نەشـــتخۆیندمەوە نەتـــدڕانم

هەمیشــە ســەرت قــاڵی ژیانــە ئــەمما ســاتێکت هــی مــن نیــە
ڕۆژانــە بــۆ چــرپەیەکت ئــەمرم، گەرچــی هــەواڵێك بــۆت چــیە
ئــەو هــەمووە گــەڕی خــۆر چــی ئــەوێت غــەیری یەڵــدای شــەوێك
قــاقڕی ئینتــزارم وەڵامیــت: ڕۆیشــتن ئــەینا ســەبووریــە

ســەختە لــە نــاو تەشــەنای فرمێســك و مــەرگی خۆتــدا بڕوێــی
گــەر داخــی وشــەیەك بــە لیــوی تاســەتەوە: خۆشــم ئــەوێی
مــەزدەترین هــەڵاتن، سووچــێکی چــۆڵی ئەســتێرەکەت نــابێ
ئــەی هــاوژینی جــوانم ئەمشــەوی ســاردی ئــامێزم لــە کــوێی؟

٢٠٠٥

# هێشتا ماوی

بنووسە چەنێك بیرت کردووم
هەتا.. هەر دوودەست بکرێتەوە
بنووسە لە چاخی بەرد و شکان
وێنەت لە تەنینەوەی
دەستنوێژی زەریادا هەڵگرتووم.

بنووسە لە فاڵی تووتیدا ژوانی من و تۆ ئەگەر نایە
ئەگەر کەسێك
ئەگەر دوورین
بەڵام شەوانە
دەستمان لە مل یەکدایە.

بنووسە بێ من ئەمری
گەرچی وتبووت
دوای تۆش ڕۆژ ئەبێتەوە
کە چارەنووس بردتی
لە پشت پێتدا ژیانت سەربڕی.

بنووسە ئەو شەوە بە قەد سیروان
لە دڵتەوە فرمێسك هات
بۆ تۆش ئیتر
مۆمەکانی نەزەرگایەك هەڵنەکران.

بنووسە شەوان
پیاسە کردنت حەسار
بە دیارتەوە ناخەوێت خەمێك

بۆ بەڵەمی تەنیاییم
کە بێ ئەسکەلە و نیشان.

بنووسە بێ من گوڵەگەزیزەت نەچنی
تا مەودا
تا دڕکی سەرشەقامەکانی ڕەشەممە و
ناو گوڵدانەکانم نەڕنی.

بنووسە بە دنیا تاڵی پرچم ناگۆڕییەوە
چەتری سەرکۆترەکانت نەبەست و
هەوری تاسەکان
هەر بە ئاسمانەوەن
لەو ڕۆژەی یەکمان نەدییەوە..

بنووسە بۆ ئێوارانی پاییز دڵت ئەگیرێت؟
بۆ خاڵکفتی سەر دەستت پیتی سین؟
ئەگەر خولیات من نیم
بۆ بێ شەم
باڵەکانت چۆن ئەمسووتێت؟!

بنووسە لە حەشریش تۆ سەر هەڵناهێنم درۆ بوو

لە بیرت نەچووە
عەسرەکەی بڕیار بە یەك
ژماردنی فەرهادەکان
بۆ ئەوینت کەم بوو.

بنووسە بۆ پەنجەکانت پڕ لە بوغزە ئومیدەکەم؟
با دڵی ئەوینیشت شکاندم
ئەزانم تۆ
وەك خودا
بۆ ئەنگوتنی هەستی..
بێ من
وەك بێ تۆ هەرگیز سەرناکەم.

بنووسە ئەگەر هاتنت
کاتژمێر لە ناو چاومدا چەکەرەی کرد
لە ناو شێعرەکانم
دایمە بسکەی لێوێکی سارد بووی
ئەگەر هێشتەوە نامەکانم
بۆ پەسڵان وەڵامت.

بنووسە لە بەر ئەو ناتوانی
بیانووی هەمیشەگیت.
تەنیا ڕستەیەك بڵێی
هێشتا ماوی...

٢٠٠٥

بـەتكای لـێبوردنـەوە لـە كۆمەڵـە شـێعری « لـە بـەر چـاوەكانت نەبوایـە شـاعیر نـەدەبووم » چـەند هەڵەیـەكی چـاپیی تیـا پـێش هاتبوو كە دروستەكەی ئەمانەیە:

لاپەڕەی ٥ دێڕی ١٠ « ئەوشەوە ئەستێرەكەمان »
لاپەڕەی ٥٠ دێڕی ٤ « بەدارەمەیتی پەنجەرەكان »
لاپەڕەی ٦٢ دێڕی ٥ « بیرم لای تۆیە .
لاپەڕەی ٧٥ دێڕی ١٤ « ئەمە خشپەی كەوتنەخوارەوەی گەڵاكانی خەفەت زەردیمە»